لە بڵاوكراوەكانی مەكتەبی ڕاگەیاندنی
كۆمەڵی ئیسلامیی لە كوردستان / عێراق
ژمارە (٤)

زنجیرەی
بنەما شەرعییەكانی كۆمەڵی ئیسلامیی

## ئاڵقەی چوارەم

# شێخ ئەبو بەصیر و هەڵسەنگاندنێكی شەرعییانەو ژیرانەی فەتوانامەكەی

عەلی باپیر



٢٠٠١ز
١٤٢٢ك

لـــەبڵاوکراوەکانی مەکتـــەبی راگـــەیاندنی
کۆمـــەڵی ئیســـلامیی لەکوردســـتان/ عـــێراق
ژمـــار(٤)



زنجیرەی

بنەما شەرعی‌یەکانی کۆمەڵی ئیسلامیی

ئاڵقەی چوارەم

# شێخ ئەبو بەصیرو هەڵسەنگاندنێکی شەرعی‌یانەو ژیرانەی فەتوانامەکەی

عەلی باپیر

١٤٢٢ك ٢٠٠١ز

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ

(ثُمَّ جَعَلْنَاكَ عَلَى شَرِيعَةٍ مِنْ الْأَمْرِ فَاتَّبِعْـهَا وَلَا تَتَّبِعْ أَهْوَاءَ الَّذِينَ لَا يَعْلَمُـونَ، إِنَّـهُمْ لَـنْ يُغْنُـوا عَنـكَ مِـنْ اللَّـهِ شَيْئًا وَإِنَّ الظَّـالِمِينَ بَعْضُهُمْ أَوْلِيَاءُ بَعْضٍ وَاللَّهُ وَلِيُّ الْمُتَّقِينَ)

الجاثية: ١٨، ١٩.

## پێشکەش بێ

١)بەئەندامانی پارێزکارو موجاهیدانی فیداکاری کۆمەڵی ئیسلامیی کە لەبەر تیشکی خۆری شەریعەت دا نەبێ بەرەو هیچ کارێك هەنگاو نانێن.

٢) بەمسوڵمانانی بەپەرۆش و دڵسۆزی کوردستان کەهیواو ئومێدی خێریان بەجەماعەتی ئیسلامیی هەیەو پشتگیریو بەهێزو پێزکردنی بەئەرکێکی شەرعیی سەرشانیان دەزانن.

# ئەم زنجیرەیە بۆ؟!

خوێنەرە بەڕێزو خۆشەویستەکان ! ئەم زنجیرە دەرسە کە هەر کامێکیان ئاڵقەیەک پێک دێنێ بەمەبەستی ئەوە بێژراونو پاشان نووسراون کە هەم بەرچاوی ئەندامو موجاهیدانی (کۆمەڵی ئیسلامیی)مان ڕۆشن بکاتەوە لەبارەی شەرعیی بوونو بەگوێرەی شەرع بەڕێوەچوونی جەماعەتەکەیانو، هەم وەڵامی سەرجەم ئەو ئیشکالو پرسیارانەش بداتەوە کە لەلایەن کەسانی جۆراوجۆرەوە ئاڕاستەی دەکرێن لەبارەی: بنەماو بنچینە شەرعیی‌یەکانی لەسەر وەستانیو، هێڵە گشتی‌یەکانی کارو چالاکییو، سیاسەتی شەرعییو ستراتیژی بەڕێوەچوونی .. هتدەوە.

دیارە (کۆمەڵی ئیسلامیی)یش هەرچەندە ئیجتیهادو بۆچوونەکانی خۆی لەبواری کارو جیهادی ئیسلامیی‌دا بەڕاستو دروست دەزانێو بەدڵنیایی‌یەوەو بە بەرچاو ڕوونی‌یەوە دەست بەکار بووە، بەڵام خۆیشی بە پارێزراو (معصوم) لەهەڵەو پەڵە نازانێو پێی وانیە کەهەقو ڕاستیی تەنها لەسەروی تاپۆ کراوە، بۆیە بەسینگی فراوانو بگرە بەسوپاسو پێزانینەوە تێبینیو ڕەخنەو پێشنیاری دڵسۆزانەی هەرکەسێک وەردەگرێو خوایار بێ بۆ تێرو تەواوکردنو کامڵ کردنی کارو جیهادەکەی بەهرەو سوودیشیان لێ‌وەردەگرێ.

دڵنیاشە کە کارو جیهادی ئیسلامیی لەگەرمەی ئێشو ژانو موعاناتو گرفتاری‌یەکان دا پێ‌دەگاتو بەردەگرێ، پێشینانیش گوتوویانە: (هیچ کەس لەپڕ نەبووە بەکوڕ).

بەهیوای ئەوە کە یەك یەکی ئەندامو دۆستو لایەنگرانی جەماعەتی ئیسلامیی بەهۆی تێگەیشتنو شارەزابوونیان لەم بنەما شەرعی‌یانەو هەزم کردنیانو پێوە پابەند بوونیانەوە هەرچی زیاترو چاکتر شەرعیی بوونو ئیسلامیی بوونی کارو جیهادی جەماعەتەکەیان ئیسپات بکەنو، بەتەئکید لەئەنجامی ئەوەشدا شایستەییو لیاقەتی ئەوە پەیدا دەکەن کە ئامانجە شەرعیی‌یەکان (المقاصد الشرعية)ی خەڵکی مسوڵمان دابین بکەنو ئایینو بەرنامەی خوای دادگەرو باڵا دەستیان بۆ بەرپاو بەسەردا پیادە بکەن.

خوای بەخشەریش هیدایەتو ڕێڕوونی خۆی بۆ هەرکەسێك کە بەئیخلاصەوە لەپێناوی‌دا تێ‌دەکۆشێ کردۆتە شتێکی مسۆگەر (وَالَّذِينَ جَاهَدُوا فِينَا لَنَهْدِيَنَّهُمْ سُبُلَنَا وَإِنَّ اللَّهَ لَمَعَ الْمُحْسِنِينَ) العنكبوت: ٦٩.

٢٩ ربيع الثاني ١٤٢٢ك

٢٠٠١/٧/٢٠ز

ئەحمەداوا.

# چەند ڕوونکردنەوەیەکی پێویست

١-سەرجەم ئەم دەرسانە کە هەرکامێکیان ئاڵقەیەکی زنجیرەی: (بنەما شەرعییەکانی کۆمەڵی ئیسلامیی) پێک دێنێ، لەخول (دَوْرة)یێک دا کە بۆ زیاتر لەسەد (١٠٠) کەس لە فەرماندەی هێزو ئەندامانی شورای هێزە تێکۆشەرەکانی کۆمەڵی ئیسلامیی لەلایەن مەکتەبی عەسکەرییەوە کرا بۆوە[1] بێژراون و پاشان لەلایەن چەند برایەکی دڵسۆزەوە لەکاسێتەوە هێنراونە سەر قاقەز.

بۆیە لەدارشتنی دەرسەکان دا شێوازی قسەکردن و دواندن هەستی پێدەکرێ و پێویستە ئەوە لەبەرچاو بگیرێ.

٢-بەمەبەستی خۆپاراستن لەنەخستنەڕوو و پەردە لەسەر هەڵنەماڵینی عەیب و عارو هەڵەو پەڵەی هەندێک کەس، گەلێک ڕاستیی گەورەمان نەخستوونەڕوو، کەواتە با بزانرێ کە لەسەرجەم ئەم دەرسانەمان دا خاتری خەڵکێک گیراوەو گەلێک بەڵگەو نموونە کەپێویست بووە بۆ ڕوونکردنەوەی مەبەست و چاکتر سەلماندی بهێنرێنەوە ، نەهێنرانەوە.

٣-هەرچەندە پێم وایە (جەماعەت) بەشێوەیەکی مەبدەئی پشتگیریی سەرجەم ئەو قسەو بیرو بۆچوونانە دەکات کە لەم دەرسانەدا خراونەڕوو، بەڵام هەتا بەشێوەیەکی رەسمی ئەوە ڕادەگەیەنێ و (تَبَنّي) یان دەکات هەر بەهی بەندە دادەنرێن و بەس خۆی لێیان بەرپرسیارەو پێویستە هەرکەسێکیش ڕەخنەو گلەیی و تێبینییەکی لەسەریان هەبێ تەنها ئاڕاستەی نووسەری بکات.

---

[1] ئەو خولە لەمزگەوتی (ئەحمەداوا) کرایەوەو لە (٢٠٠١/٦/٢٣) تا (٦/٢٧)ی خایاند.

٤-گەلێك لەو باس و بابەتانەی کە لەم دەرسانەدا هاتوون توێژینەوەو لێکۆڵینەوەی زیاتر هەڵدەگرن و لەم دەرسانەدا زیاتر هەوڵ دراوە مەسەلەکان بەکورتی و پوختی بخرێنەڕوو، بۆیە هەرکەسێك بیەوێ وردترو روونتر لەبۆچوونی بەندە تێبگات پێویستە بگەڕێتەوە بۆ بەرهەمەکانی دیکەی و بەم دەرسانە وازنەهێنێ، بۆ وێنە:

لەبواری عەقیدەو ئیمان دا بگەڕێتەوە بۆ: (زنجیرە دەرسەکانی ئیمان و عەقیدەی ئیسلامیی لەبەر تیشکی قورئان و سوننەت دا) کە پەنجا (٥٠) دەرسی یەك سەعاتی یەو بەکاسێتی تەسجیل و ڤیدیۆش تۆمارکراون و خراونە سەر قاقەزو ئامادەی چاپیش کراون.

٥-بەندە چ لەم دەرسانەم و چ لەهەر کتێب و وتارو بەرهەمێکی دیکەشمدا هەر هەڵەو ناشەرعیی یەکم گوتبێ[٢]، کە بە بەڵگە بسەلمێنرێ هەڵەیە، ئەوە بەزیندوویی و مردوویی لێی پەشیمانم و زۆریش مەمنوونی هەرکەسێك دەبم کەدڵسۆزانە بیخاتە بەرچاوم و، بۆم راست بکاتەوە، دیارە مەبەستیشم ئەوە نیە کە لەقسەو نووسینەکانم بەگومان بم، بەڵام مەبەستم رێگای تۆمەت بەستن و بیانووبڕینە لەکەسانێك کەبەهەق و ناهەق قسەی جۆراوجۆر دەپڕژێنن و هەرجارە مەسەلەو بابەتێك دەورووژێنن.

---

[٢] زۆرم پێ سەیر بوو کەبیستم هەندێك برا - خوالێیان ببورێ- گوتبوویان: فلانەکەس (واتە بەندە) وشەیەکی (کفر)ی گوتوە! چونکە لەوتارێکدا گوتوویەتی: (ئەگەر مەلائیکەتی ئاسمانیش زوڵم لەگەڵ کورد بکات ئێمە لێی قبووڵ ناکەین)، جا من ئێستا ئەو قسەیەم لەیادە کەچۆن چۆنی و لەچ (سیاق)ێك دا گوتوومە، بەڵام هەرئەوەندە دەڵێم کە کەسانێك قسەی وا بە (کفر) دابنێن دیارە زۆر بێئاگاو نەشارەزان، چونکە ئەگەر بەپێی ئەو قسەیەی من بگونجێ (ظلم) پاڵ بدرێتە لای مەلائیکەکان، دەبێ بەپێی ئایەتی: (..لَئِنْ أَشْرَكْتَ لَيَحْبَطَنَّ عَمَلُكَ وَلَتَكُونَنَّ مِنَ الْخَاسِرِينَ) الزمر: ٦٥یش بگونجێ هاوبەش بۆ خوادانان (الأشراك بالله) پاڵ بدرێتە لای پێغەمبەرمان محمد ﷺ ،!! هەرچەندە لە (سیاق)ی ئەو وتارەدا من مەبەستم فریشتەکان نەبوون و مەبەستم ئەوە بووە کەئەگەر کەسێك هەرچەندە زۆر پیاو چاك و مسوڵمانیش بێت، مادام زوڵم بکات لێی قبووڵ ناکەین، بەڵام ئەگەر گریمان مەبەست پێی مەلائیکەش بێ هەر هیچی تێدا نیە، چونکە مادام (ئەگەر - لئن) ی چووە سەر هیچ حوکمێکی لەسەر بنیات نانرێ و مەبەست لەوجۆرە قسانەش (مبالغة)یەو هیچی تر.

# ئەم ئاڵقەیە

ئەم ئاڵقەی چوارەمەی زنجیرەی (بنەما شەرعی‌یەکانی کۆمەڵی ئیسلامیی) دەرسی چوارەمەو وەك پێشتر گوتوومانە لەخولێکی تایبەت بەفەرماندەو کادیرە عەسکەری‌یەکانی کۆمەڵی ئیسلامیی‌داو لەرۆژی (٦ی ربیع الثاني ١٤٢٢)ی کۆچی بەرانبەر بە (٢٠٠١/٦/٢٦)ی زایینی‌دا گوتراوەتەوەو پاشان برایەکی بەڕێز لەکاسێتەوە هێناویەتە سەر قاقەزو دواتریش کاك (مەلا بلال پیرۆت قەڵادزەیی) پێیدا چۆتەوەو سەرلەنوێ نووسیویەتەوەو داپڕشتۆتەوەو دوایی خۆیشم وەك دەرسەکانی دیکە چاوم پێیدا خشاندۆتەوەو بەپێی پێویستو بۆلوان دەستکاری چەند وشەو ڕستەیەکیم کردوە.

خواش بە بەخششی بێ سنووری خۆی پاداشتی سەرجەم ئەو برا دڵسۆزانە بداتەوە کە بەم بەرهەمەو بەرهەمەکانی دیکەی بەندەشەوە بەشێوەیەك لەشێوەکان ماندوو بوونو دەبنو مشووری پارێزرانو کۆکردنەوەو نووسینەوەو چاپو بڵاوکردنەوەیان دەخۆنو، خۆیشم هەر هێندەم پێ‌دەکرێ سوپاسو پێزانینمیان بۆ دەرببڕمو بۆیان لەخوای بەخشەر بپاڕێمەوە کە پاداشتی هەرە چاکیان بداتەوەو هەمیشە ساغو شادو سەر بەرزو سەرفرازیان بکات.

شایانی باسیشە کە ئەو فەتوانامەیەی کەبەندە لەم دەرسی چوارەمەدا بەربەرچم داوەتەوە، کەسانێکی دڵنەخۆشو کەم شارەزاو هۆش ماوەیەك کردبوویان بەکەرەستەیەکی گرنگی بانگەشەو پڕوپاگەندەی ناحەزانە لەدژی کۆمەڵی ئیسلامیی بەگشتیو بەندەش بەتایبەت، بەڵام خوا پشتیوان بێ پاش بیستنی ئەم دەرسە یان خوێندنەوەی زۆر چاك دەردەکەوێ کە ئەوجۆرە فەتوانامەو قسەو باسانە زۆر لەوە گچکەترن کەتەنانەت تۆسقاڵێکیش لەقەڵای مەحکەمی شەرعیی

بوونی کۆمەڵی ئیسلامیی بڕووشێنن، هەروەها پێویستە ئەوەش بگوترێ کە کاك (ابو بصیر) لەم فەتوانامەیەی‌دا دووچاری چەندان هەڵەی زەق بووە کە ئاماژەیان پێ‌دەکەین‌و بەداخەوە ناوبراو لەو فەتوانامەیەی‌دا بەپێچەوانەی بەرهەمەکانی دیکەی پەلەپەل‌و کەم وردبوونەوەو لێ‌نەکۆڵینەوەو هەڵچوون (إنفعال)ی زۆر پێوە دیارە.

وە دەبێ وەك ئەمانەتی عیلمی ئەوەش بڵێم کە ناوبراو پاش ئەوەی چەند برایەکی ئەهلی عیلم لەئەندامانی (کۆمەڵ) و دڵسۆزانی بەندە، بەتەلەفۆن‌و فاکس دواندوویانەو حەقیقەت‌و واقیعی شتەکانیان بۆ ڕوون کردۆتەوە، زۆر سەغڵەت (مُحْرَجْ) بووەو، ئۆباڵەکەی خستۆتە ملی کەسانێکەوە کە بەسەهوویان بردوەو زانیاری هەڵەیان داوەتێ!

پاشانیش کە داوایان لێ‌کردوە بەرپەرچی فەتوانامەکەی خۆی بداتەوە، عوزری هێناوەتەوە، بەڵام ویستوویەتی بەوە هەڵوێستە هەڵەکەی قەرەبوو (تعویض) بکاتەوە کە هەرچی لەئەنتەرنێت دا بوویەتی لەبارەی ئیسلامی‌یەکانی کوردستانەوە هەمووی سڕیوەتەوە!

هیواداریشم هەم شێخ (ابو بصیر) و هەم خەڵکی‌تریش لەوجۆرە ڕووداوانە پەندو عیبرەت وەربگرن‌و، هەم برا ئیسلامی‌یە کوردەکانیشمان چی‌تر پەندی (گڵی دوور دەرمانە)یان بەسەردا نەچەسپێ‌و، هەم برا ئیسلامی‌یە عارەب‌و تورك‌و فارس‌و ئەفغانی‌و چی‌و چی‌یەکانیشمان پێیان وانەبێ کە برا کوردە مسوڵمانەکانیان هەر چونکە کیان‌و دەوڵەتی دان پێداهێنراوی خۆیانیان نیە! لەئیسلام‌و دینیش دا نەشارەزاو کۆڵەوارن‌و، بادڵنیاو بەرچاو ڕوون بن کە ئەم هۆشیاری‌و ڕابوونە ئیسلامیی‌و کاروانە جیهادی‌یەی کوردستان هەر لەخۆوە سەری هەڵنەداوەو کەسانێکی چاوساغ‌و مشوورخۆری هەر هەن کە سەرقافڵەیێتی دەکەن‌و بەڕێوەی دەبەن!

# پێشەکی

بسم الله الرحمن الرحيم

الحمدلله والصلاة والسلام على رسول الله محمد وعلى اله وصحبه ومن اهتدى بهداه. ربَّنا آتِنا مِنْ لَدُنْكَ رحمةً وَهيئْ لَنا مِنْ أمْرِنا رَشَداً.

بەڕێزان! ئەم دەرسی چوارەمەمان لەبنەما شەرعی‌یەکانی (کۆمەڵی ئیسلامیی) بریتیە لە: هەڵسەنگاندنی فەتوانامەیەکی کاك (ابو بصیر) کە نووسەرێکی ئیسلامی‌یەو چەند کتێب‌و نامیلکەیەکی هەیە، کەم‌و زۆر جێی سوودو کەڵکی مسوڵمانانن، وە ئەو برایە خەڵکی ئوردون (الأردن)ە و ئێستا لە (لەندەن) دادەنیشێ.[1]

ناوبراو پاش ئیعلانکردنی کۆمەڵی ئیسلامیی (الجماعة الأسلامية) بە چەند ڕۆژێك فەتوانامەیەکی بڵاوکردۆتەوە کە بۆ کوردستان‌و بۆ شوێنی تریشی ڕەوانە کردوە.

وە فەتوانامەکەی بۆ ئێمە شتێکی چاوەڕوان نەکراو و کت‌وپڕ بوو، وە تێیدا تووشی چەند هەڵەیەك بووە، پێم وایە کەهۆیەکەی ئەوە کە بە پەلەپەل‌و لەژێر کاریگەریی چەند مەعلووماتێکی هەڵەو، وە بەبێ ئاگاداری لەواقیعی کوردستان نووسیویەتی، جا من تێبینم لەسەر نامەکەی زۆرن، وەنامەکەی چەند لاپەڕەیەکەو من چەندان ڕەخنەم لەسەری هەن‌و بەگوشراوی لەیازدە (١١) خاڵدا دەیانخەمەڕوو.

---

[1] هەرچەندە فەتوانامەکە زیاتر بەناوی (ابو بصیر)ەوە ناسراوە، بەڵام لەکۆتایی‌یەکەیدا نووسراوە: الشيخ عبدالمنعم مصطفى حليمة/ الشيخ محمد مصطفى المقريء (ابو إيثار) ١٤٢٢/٣/١٥ هـ - ٢٠٠١/٧/٦م.

# ١-نەناسینی واقیع و شارەزانەبوونی

یەکەم تێبینی و ڕەخنەمان لەسەر نامەکەی کاك (ابو بصیر)[٢] ئەوەیە کە ئەو برا بەڕێزە بەبێ ئاگاداری لەواقیعی کوردستان و لەواقیعی (بزووتنەوەی یەکبوونی ئیسلامی) پێشوو، وەبەبێ ئاگاداری و ئاشنایی و شارەزایی بە (کۆمەڵی ئیسلامیی) و هەل ومەرجی ئیعلانکردنی، ئەو فەتوانامەیەی ناردوە، لەکاتێك دا کەخوای پەروەردگار دەفەرموێ: (ولاتَقْفُ مالَیْسَ لَكَ بِـهِ عِلْـمٌ) واتە: بەدوای شتێك مەکەوە کە زانیارییت لەبارەیەوە نیە.

مسوڵمان نابێ تفەنگ بەتاریکی یەوە بنێ، وەنابێ فەتوا لەبارەی شتێك بدا کە شارەزایی نیە و نابێ حوکمی بۆ دەربکات.

ئەوەش کەبەبێ شارەزایی لەواقیع ئینسان بۆی نیە فەتوا لەسەر شتێك بدات و ڕوونکردنەوەی لەسەر دەربکات، شتێکە کەهەموو زانایان لەسەری یەك دەنگن، بەتایبەت لەسەر ئەو مەسەلانەی کە پەیوەندی یان بەکۆمەڵگاو مەسەلەی جیهادو جم وجوڵی کۆمەڵگاوە هەیەو لەکاتێکەوە بۆ کاتێکی تر و لەشوێنێکەوە بۆ شوێنێکی تر دەگۆڕێن، بەپێی جیاوازی هەل ومەرجەکان حوکمیان دەگۆڕێ، وە بابای (مفتي)و دادوەر دەبێ زۆر ئاگاداری ئەو هەل ومەرج و واقیعە جیاجیایانە بێت.

(ابن القیم) ڕەحمەتی خوای لێبێ لەکتێبی (إعْلامُ الموقعین عن رب العالمین) لەژێر سەرباسی: (بِمَ یَتَمَكَّنُ الحاكِمُ مِنَ الفَتوى والحُكْم؟!)دا لەوبارەوە نووسیویەتی: (ولایَتَمكَّنُ المُفتي ولاالحاكِمُ مِنَ الفَتْوى والحُكْم

---

[٢] هەروەها شێخ (ابو إیثار)یش کەشەریکی بووە لەنووسینیداو بەپێویستی نازانم هەموو جارێ ناوی ئەم برایە بهێنم چونکە پێم وایە زیاتر (تابع) بووە.

بالحَق إلا بنَوْعَيْنِ مِنَ الفَهْم: أحَدُهُما: فَهْمُ الواقعِ والفقْهِ فيه وآستِنْباطُ عِلْمِ حَقيقةِ ماوَقَعَ بالقرائنِ والأمارات والعَلامات حتّى يُحيْطَ به علماً، والنوعُ الثاني: فهم الواجِبِ في الواقعِ وهو فهم حكم الله الذي حَكَمَ بهِ في كتابهِ أو على لِسانِ رَسُولِهِ في هذا الواقعِ ثم يُطبّقُ أحَدَهُما على الآخَرِ، فالعالِمُ مَنْ يَتوصَّلُ بِمَعْرِفةِ الواقِعِ والتَفقهِ فيه الى مَعْرِفةِ حُكْمِ الله ورسوله، كما تَوصَّلَ شاهدُ يوسف بِشَقّ القميصِ مِنَ الدُّبُرِ الى مَعْرِفةِ بَراءَتِهِ وصِدْقِهِ، وكما تَوَصَّلَ سُلَيْمانُ عليه السلام بِقَوْلِهِ: (إئْتوني بالسكين حتَّى أشُقَّ الوَلَدَ بَيْنكُما) الى معرفةِ عينِ الأُم..)

واته: (موفتیو دادوەر ناتوانن بەشێوەیەکی ڕاستو دروست حوکم دەربکەن مەگەر دووجۆرە زانیاریو شارەزاییيان هەبێ، یەکەم: ئەو واقیعو بارودۆخەی کەقسەی لەبارەوە دەکات، دەبێ زۆری پێشارەزاو ئاشنابێو بتوانێ بەهۆی پەی پێبردنی نیشانەکانییەوە کاکڵو هەقیقەتەکەی وەدەست بخات. جۆری دووەم: ئەوەیە کەبزانێ بۆ ئەو واقیعو ڕووداوە چی پێویستە؟ کە بریتییە لەحوکمو بڕیاری خوای پەروەردگار کە لەقورئانێدا یان لەسەر زمانی پێغەمبەری خۆی (محمد ﷺ) خستوویەتەڕوو لەوبارەوە، ئنجا دوای ئەوەی هەم واقیعەکەی ناسیو هەم حوکمو بڕیاری شەرعیی لەبارەیەوە زانی کەبێگومان لەدوو تویی کتێبی خوا یان سوننەتی پێغەمبەری ﷺی پێشەوادا هەیە، یەکسەر حوکمو بڕیارە شەرعییەکە بەسەر ئەو واقیعەدا جێبەجێ (تطبیق) دەکات.

ئەنجا دەڵێ: زانا (عالم) بەکەسێك دەگوترێ کەبەهۆی شارەزایی لەواقیعو تێگەیشتنی لەحوکمو بڕیاری خواو پێغەمبەرەکەیەوە ﷺ بتوانێ حوکمی شەرعی واقیعەکە دەرك بکات، وەك چۆن ئەو شاهیدە

تەماشای کرد کە کراسەکەی (یوسف) لەپشتەوە دڕابوو، زانی حوکمێکی ڕاست دەربکات کە (یوسف) بەرییە لەوەی کەزیناى کردبێ (چونکە ئەگەر هاتباو (یوسف) علیە السلام خۆی هەوڵی ئەوەی دابایە کراسەکەی لەپێشەوە دەدڕا، مادام لەپشتەوە دڕاوە، مانای ئەوەیە کەئافرەتەکە یوسفی ڕاکێشاوە، ئەوە ناسینی واقیعەو گەیشتنە بەحوکمی شەرعی کە ئەو ئینسانە پاك (بریئ)ە[٣]).

(وە هەروەها وەك ئەو بەسەرهاتەی سولەیمان (علیە السلام) کە لە فەرموودەی (صحیح)ی پێغەمبەردا ﷺ هاتوە کە ڕۆژێك دوو ئافرەت دەبێتە کێشەیان لەبەرئەوەی کەهەریەکەیان منداڵێکی پێدەبێ و گورگێك دێت یەکێك لەو دوو منداڵە دەفڕێنێ، یەکێك لەژنەکان دەڵێ: هی تۆی بردوە، ئەوی دیکەیان دەڵێ: نەخێر هی تۆی بردوە، لەئەنجام دا دەچن بۆلای (داود) پێغەمبەر علیە السلام، ئەویش حوکم دەکات کەهی ژنە بەتەمەنەکەیانە، لەکاتی هاتنە دەرەوەیان دا (سلیمان) علیە السلام دەبینن و مەسەلەکەی بۆ باس دەکەن. ئەویش دەیانگێڕێتەوەو، دەڵێ: من بەشێوەیەکی‌تر حوکمیان دەکەم ئەگەر فرمانت لەسەربێ، باوکیشی دەڵێ: چۆن؟ (سلیمان) دەڵێ: چەقۆیەکم بۆ بێنن منداڵەکە دەکەم بەدوو لەتەوە، هەر دایکەی نیوەی بەر بکەوێ، لەوکاتەدا دایکە بچووکەکە کە دایکی ڕاستەقینەیە دەڵێ: هی من نیە، بەڵکو هی ئەو ژنە گەورەیە، ژنە گەورەکەش دەڵێ: قەیدی نیە لەتی بکەن من ڕازیم بە بەشی خۆم، بەمەش (سلیمان) دەزانێ کە کامیان دایکی ڕاستەقینەی منداڵەکەیەو پێی دەداتەوە).[٤]

---

[٣] ئەوەی نێوان دوو کەوانکە خۆم بۆ زێدە ڕوونکردنەوەی مەبەست زیادم کردوە.

[٤] (ابن القیم) تەنها ئاماژەی بەڕووداوەکە کردوە بەڵام من بەدرێژی هێنام بۆ زیاتر ڕوون بوونەوەی مەبەست.

لێرەش دا بەهۆی واقیعەکەوە (سلیمان) توانی حوکمە شەرعی‌یەکە بەڕاستی‌و دروستی هەڵبهێنجی‌و حوکم بەسەر مەسەلەکەدا بدات.

جا سەرنج بدەن کاك (ابو بصیر) لەیەکەم خاڵی نامەکەی‌دا ئاوا دەڵێ:

(هذا الأنشقاق الذي قام به (الشیخ علي باپیر) لانری شَرْعیَّتَهُ ولا مُبرراتِهِ لأنَّهُ لایَزیْدُ المُسلِمینَ الا فُرقَةً وضُعْفاً ولایَسْتَفیدُ مِنْهُ الا اعداءُ الأمَّةِ الذینَ یَتَرَبَّصونَ بالمسملین الدَّوائر).

وەك دەبینین لەم دوو دێڕەدا کاك (ابو بصیر) چوار جۆرە حوکمی هەڵەمان بەسەردا دەدات:

ا-بەبێ ئەوەی کەبزانێ ئێمە چی‌مان کردوەو چۆنمان کردوەو لەچ هەل‌و مەرجێك دا بووین، یەکسەر ناوی دەنێ (إنْشقاق)!!.

ب-ئنجا یەکسەر حوکمی ناشەرعیی بوونی بەسەردا دەدات!.

ج-پاشان دەڵێ: مسوڵمانان تووشی بێ‌هێزیی‌و پەرتەوازەیی دەکات!.

د-وە لەکۆتایی‌دا دەڵێ: تەنها دوژمنانی ئۆممەت کەڵکی لێ‌وەردەگرن!

ئاشکراشە کە هەرکەسێك ئاگاداری حاڵ‌و باڵی ئێمە بێت‌و بزانێ دنیا چ باسە، دڵنیا دەبێ کە ئەو برایە بێ‌ئاگایە لەهەر چوار حوکمەکانی‌دا بەهەڵەدا چووەو بەراوەژوو حاڵی بووە.

بەڵام ئایا دەزانن برای ناوبراو لەسەر چ بناغەیەك ئەو تێڕوانین‌و هەڵسەنگاندنەی بۆ دروست بووە؟! ئەوە لەڕەخنەو تێبینی دووەممان دا باسی دەکەین.

# ٢-حوكم دەركردنی یەك طەڕەفانە

شێخ ئەبووبەصیر کەخۆی کردۆتە (مفتی)و دادوەر و ئەو هەموو حوکمە قورسانەی بەرانبەر بە(کۆمەڵی ئیسلامیی)مان دەرکردوون وێڕای نەشارەزایی و نائاشنایی بەواقیع (عدم الفقه بالواقع) لەسەر بناغەی بیستنی دەعوایەکی یەك طەرەفانەش ئەو هەڵوێستەی وەرگرتوە!

چونکە کاتێك برایانمان ناردو تەلەفۆنیان لەگەڵ کردو بەفاکس نامەیان بۆ ڕەوانە کرد، ڕەفتارەکەی خۆی بەوە پاساو دابۆوە کە یەکێك لەکوڕەکانی ڕابەر تەلەفۆنی بۆ کردوەو مەسەلەکانی بەوجۆرە بۆ باس کردوە!

جا بێگومان (عوزر لەقەباحەت خراپتر) بۆ حاڵەتێکی ئاوا بێژراوە، چونکە تێکڕای زاناو پێشەوایانی ئیسلام و سەرجەم عاقڵ مەندانی دنیاش لەسەرئەوە یەکدەنگن کەبابای قازی و دادوەر بەبێ بیستنی قسەو بەڵگەی هەرکام لە (مُدَّعِي)و (مُدَّعی علیه) دروست نیە حوکم و بڕیار دەربکات و لەوبارەوە گوتراوە: ئەگەر یەکێك هاتەلات و چاوێکی لەسەر دەست بوو و دەرهێنرابوو نابێ یەکسەر پێی بڵێی: ستەم لێکراوی تاکو تەرەفی بەرانبەریش دەبینی چونکە ڕەنگە ئەویان هەردووك چاوی دەرهێنرابن!

بەڵێ وا دیارە کاك (ابو بصیر) ئەم پەندە عارەبی یەی نەبیستوە کە دەڵێ: (ضَرَبَني وَبكى سبقني فاشتكى)! کوردیش گوتوویانە: (هەر کەس نیە لەماڵم ئاگای نیە لەحاڵم).

ئاخر کاك (ابو بصیر) تۆ چۆن هەر لەبەرئەوەی بابایەکی درۆزن لە (.......) وە تەلەفۆنێکی بۆ کردووی و هەندێك درۆو دەلەسەی بۆ کردووی، چۆن دەبێ چەندان حوکمی هێندە قورس و ترسناکمان بەسەردا بدەی، بێ ئەوەی هەر پرس و ڕایەکیشمان پێبکەی کەئایا ئەوەی بابای (مُدَّعِي) لەسەرتان دەیڵێ وایە یان نا؟!!

پێم ناڵێی ئەوجۆرە فەتوادان و داوەریی کردنە لەکوێی قورئان و سوننەت یان کتێبە شەرعی یەکانیش دا هەیە؟!

# ٣-تۆمەتی سەرپێچی‌کردن لەدەقە شەرعیی‌یەکان پاڵدانە لامان

ڕەخنەو تێبینی سێیەممان لەسەر ئەو فەتوانامەیەی شێخ ئەبووبەصیر ئەوەیە کە بێ‌سێ‌و دوو کردن، کارەکەی ئێمەی بەدژو پێچەوانەی دەقە شەرعیی‌یەکان داناوە گوتوویەتی: (إضافة الى كَوْنِهِ مُخالِفاً للنّصوصِ الشرعية العَديدَة الّتي تأمُرُ بالوَحْدَةِ والأعتصامِ بِحَبْلِ الله جَميعاً ونبذِ التفرّق والتناحُرِ والأختلافِ)

دیارە ئێمەومانانیش وەك ئەو برایە ئاگامان لەئایەتەکانی قورئان‌و فەرمایشتەکانی پێغەمبەرمان ﷺ هەیە کەفەرمان بەبرایەتی‌و یەکڕیزی‌و تەبایی دەکەن‌و جیا جیایی‌و ناتەبایی‌و پەرتەوازەیی قەدەغە دەکەن، بەڵام بێگومان بناغەی برایەتی‌و تەبایی‌و یەکڕیزیی بریتیە لەملکەچی هەموو لایەکمان بۆ شەرع‌و دەست گرتنمان بەڕێسمانی قایمی خواوە (إعتصامنا بحبل الله المتين)!

هەربۆیەش خوای کاربەجێ بەرلەوەی فەرمان بە یەکبوون (وحدة) بکات فەرمانی بە (بۆ شەرع مل کەچ بوون) کردوەو فەرموویەتی: (وأعْتَصِمـوا بحبـل الله جميعـاً ولاتفرّقـوا..) آل عمران: ١٠٣، چونکە تەنها دەستەبەرکەر (ضامِنْ)ی برایەتی‌و یەکڕیزیی مسوڵمانان‌و تاکە پارێزەریان لەجیاجیایی‌و پەرتەوازەیی بریتیە لەپابەندیی هەموویان بە بەرنامەی خواوە کە بۆ هەموویان وەك یەکەو بەیەك چاو سەیریان دەکات.

بەڵام حەیفێ ناوبراو لەسۆنگەی ئەوەوە کە شارەزای وەزعی ئێمە نەبووەو تفەنگی بەرتایکی‌یەوە ناوە. نەیزانیوە کەئێمە نەك هەر

پێچەوانـەی دەقـە شـەرعی‌یەکان نەجوولاوینـەوە بـەڵکو ئـەوە دەقـە شەرعیی‌یەکان بوو ون کەئێمەیان ناچار کردوەو پاڵیان پێوە ناوین بەو کارە هەڵسین‌و ئەو گۆڕانکاری‌یە بوێرانەیە بکەین!

نـاوبراو وا حـاڵی کـراوە کەئێمـە لـە (بزووتنـەوەی یـەکبوونی ئیسلامیی)دا یەکڕیزو یەکدەنگ‌و ڕەنگ‌و تۆکمە بوو وین! بەڵام جگە لەو برایەو هاو وێنانی کەدوورو بێ‌ئاگا بوو ون، هەموو کەس دەزانـێ کـە (یەکبوون) ناوێکی خـۆش‌و بـۆش بـوو و، لـەنێوەڕۆک دا چـەند بـوون‌و لـەت‌و پـەت بـوون بـوو! ئەویش لەسـۆنگەی ئـەوەوە کـە وەحدەتەکـە لەئەسڵدا بۆ خوا نەکرابوو و یەکگرتنی دوو کۆمەڵی ئیسلامیی نەبوو – هەرچەندە لەلای زۆربـەی هـەرەزۆری قیـادەو قـاعیدەی دوو کۆمەڵەکـە وا تەفسیرکرا بوو –، بەڵکو کـەین‌و بـەینی نێـوان دوو بـراو کوڕەکانیـان‌و یەکخستنەوەی خێزانێکی شیرازە پچڕاو بوو و هیچی‌تر![5]

وە لەڕاستییدا ئێمەو مانان بەهاندەریی چی‌تر صەبر نەگرتن لەسەر پێشـێل کرانـی دەقـە شـەرعی‌یەکان‌و بـەها بـەرزەکانی ئیسـلام‌و وەك: برایەتیی‌و دادگەریی‌و بەزەیی لەنێو خۆداو، هەڵس‌و کەوت کردن لەسەر بناغـەی دۆسـتایەتی گرتـن‌و و دوژمنایـەتی‌کردن لەبـەر خـوا (المـوالاة والمعــاداة في الله) و پاراســتنی ســنوورەکانی ئیمــان‌و عــەقیدەو عیززەتمەندیی ئیسلامی‌یانە لەبواری پەیوەندی دەرەکیی‌دا، بـەڵێ بـەم هاندەرو پاڵنەرە بەرزو پیرۆزەوە ئەو هەنگاوەمان نا!

---

[5] واتـە هـاندەرو پاڵنـەرە ئەسڵی‌یەکەی لەلایـەن هـەردووك بـرای پـێش سـپی دوو بزووتنەوەکەو دەوروبەریان ئەوە بووە، ئەگەرنا خەڵکی دیکەی نێو دوو بزووتنەوەکە ئاگایان لەو کەین‌و بەینە نەبووەو بەئیخلاصەوە ئەو یەکبوون‌و یەکگرتنەیان کردبوو.

# ٤-ورده هەڵەو سەرپێچی ئیداریی، یان پێشێل کردنی شەرع و شوورا؟!

هەڵەیەکی دیکەی برای ناوبراو ئەوەیە کە ئەو هەموو کەم وکووڕی و پێشێلکاری یانەی (ڕابەر) بۆ شەرع و بەرنامەو پەیڕەوی نێوخۆو بڕیارەکانی ئەنجوومەنی شووڕاو ستەم و بێدادیی و پاشاگەردانی یەی کەسەرتاپای بزووتنەوەی گرتبۆوە، بەهەندێك ورده هەڵەی شەرعیی و ئیداریی دەزانێ و دەشڵێ دەبووایە بەشێوەی ئامۆژگاریی و فەرمان بەچاکەکردن و ڕێ لەخراپەگرتن چاك کرابانایە!!

دەڵێ: (ومايمكن ان يُقالَ عن بَعْض المخالفات الشرعية والأدارية التي يَقعُ فيها طرفٌ مِنَ الأطرافِ فأنها تُزالُ بمواظبةِ النصح والأمْرِ بالمعروفِ والنهي عن المنكرِ بالتي هي أحسَنُ ولَيْسَ بخطأٍ او منكر اكبَرَ..)!!

وەك پێشتریش گوتم هۆکاری سەرەکی ئەوجۆره هەڵوێست و بڕیاره هەڵانەی ئەو برایه ئەوەیە کە شارەزای واقیع و وەزعی ئێمە نیەو لێمان بۆتە دارکەری شەوێ (حاطب ليلٍ)، چونکە هەرچی ئەو پێشنیاری کردوە ئێمە بەحەوت قات و زیاتریش جێبەجێمان کردوە، ئنجا کە لەخۆوە تۆمەتبارمان دەکات. بەوەی کەئێمە بەناشەرعیی (منکر)یەکی گەورەتر ناشەرعیی (منکر)یەکی گچەکەمان لابردوەو سەرەنجام زەرەرمان کردوە، نەی پێکاوە، چونکە ڕاستی یەکەی ئەوەیە کە ئێمە چەندان ناشەرعیی زل زلمان لابردوون کەپێشتر ئاماژەیان پێکراوە بەشێوازێکی شەرعیی، بەڵێ ئێمە لە (بێ بەرنامەیی)و (ڕاوێژ نەکردن) و (تاکڕەویی) و (ئامانج لێ بزر بوون) و (دۆست و دوژمن لێ تێکەڵ بوون) و (پەرتەوازەیی) و (چەند دەستەو تاقمی جیاجیا بوون) ەوە خوا پشتیوان بێ گواستوومانەتەوە بەرەو پێچەوانەی ئەو شتانە کەهەبوونی بەرنامەو پەیڕەو و سیاسەت و ستراتیژێکی ڕوون و کاربەپێی ڕاوێژ (شوری) بەڕێوەبردن و دیاریکردنی ئامانجە شەرعیی نیزیك و دوورەکان و لەیەك جیاکردنەوەی دۆست و دوژمن و یەك دڵیی و یەکڕەنگیی و یەك هەڵوێستی و.. هتدن!

## ٥-ئایا ڕاستە تەنها دوژمنانی ئیسلام بەم گۆڕانکارییە دڵخۆشن و لێی بەهرەمەندن؟!

هەڵەیەکی دیکەی شێخ (ابو بصیر) ئەوەیە کە سەرەڕای مۆری جیابوونەوە بەو گۆڕانکارییەوەنان کە کۆمەڵ (جماعة) پێی هەڵساوە کەپێشتر باسمان کردوەو بەرپەرچمان داوەتەوە، بێ ئەوەی لەوەزعی ئێمەو گۆڕەپانی کوردستان و عێراق ئاگادار بێت ئیدیعای ئەوەی کردوە کە تەنها دوژمنانی ئیسلام بەوکارە دڵخۆشن و هەر ئەوانیش لێی بەهرەمەند دەبن!! گوتوویەتی: (هذا الأنقسامُ لايَسُرُّ إلا العدوَّ والمستفيد منه هم أهلُ الباطلِ في المنطقة وحواليها..)

بەڵام بێگومان ئەم بۆچونەی ناوبراو پێم وا نیە جگە لەخۆی کە بێ ئاگاو نەشارەزایە بەواقیعمان و جگە لەکەسانێکی وەك وی بێ ئاگاو نەشارەزا، یان بەرژەوەند لێ تێکچوو، هیچ کەسی تر هەیبێ، بەڵکو بەپێچەوانەوە سەرجەم ئەندام و کادیرانی خۆمان لەنێوەو دەرەوەی کوردستان وە هەموو ئەو مسوڵمانانەی کە کەم و زۆر بەحاڵ و باڵمان ئاشنا بوو ون زۆر شادو بەختەوەرن و پێیان وایە لەخەونێکی ناخۆش بێدار بوونەوەو کابووسێکی قورسیان لەسەر سینگ لاچووە، وە دوژمن و ناحەزانیشمان پێیان ناخۆشەو حەزیان دەکرد (بزووتنەوە) جیهادی یەکەمان بەو دەردو نەخۆشی کوشندانەیەوە کە گرفتاریان بوو بوو داڕزابایەو سەری نابایەوەو لەپرسەو تازیەکەیدا بەشداری یان کردبایە!

ئنجا ئەگەر گریمان کەسانێکی بێ ئاگاو سەرکێڵ و ڕواڵەت بینیشیان ئێستاکە دڵخۆش بن، دوایی بۆیان ڕوون دەبێتەوە کە لەحیسابا تیان دا بەهەڵەدا چوو ون!

# ٦- پێشنیارێك كە پێشتر جێبەجێكراوەو بێسوود بووەو دادی نەداوە

ڕەخنـەو تێبینی‌یـەكی دیكـەمان لەسـەر فەتوانامەكـەی شـێخ ئەبووبـەصیر ئەوەیـە كـە بێ‌ئـەوەی لەئێمـە بپرسـێ كـەئایا بـەر لـەو گۆڕانكاریی‌یەو لادانەی ڕابـەر چی‌و چی‌تـان گوتـوەو كـردوە، یەكسـەر پێشنیارێك لەشێوەی خۆزگەو بڕیادا دەخاتەڕوو كە دەبووایە بەرلەوەی ئـەو هـەنگاوەمان نابایـە كێشـەكەمانمان گێڕابایـەوە بـۆلای قوئـان‌و سـوننەت‌و لیژنەیـەكی دادوەر (حَكَـمْ) و هـەموو لایـەكیش بەبڕیارەكانی‌یەوە پابەند بوونایە!!

دەڵێ: (الواجِبُ عند حصول نِزاعٍ بين المسلمين انْ يُـرَدَّ الـنزاعُ أيّـاً كانت طبيعتُهُ وصِفتُهُ الى اللهِ ورسولِهِ اي الكتاب والسنةِ وكُنا نَودُّ من الأخوانِ على الأقل قبل أن تَصِلَ الأمور الى الموصل الذي وَصَلَ اليه أن يجعلوا حكَماً عليهم من العلماء العاملين يحكمون بينهم بالكتاب والسنة ويكون حُكْمهُ مُلْزِماً للطرفين)

ئـەو برایـە نازانـێ كـە لیژنـەی دادوەرو خـەڵكی زانـاو شـارەزاشمان لەبەین دا بوون‌و زۆریشمان پێوە ماندووبوون‌و ڕێك كەوتن نامە (إتفاقية) و صوڵحنامەشمان لەنێواندا ئیمزا كراو، لەوانەش زیاتر كراو چەندان جاریش ڕابەرو دەورووبەری بەڵێن‌و پەیمانیان دا، بەڵام سەرەنجام سەری لەهیچەوە دەرچوو، بەڵێ ڕاستە كە گوتراوە: (تێگەیشتن لەپڵاوخواردنێ خۆشترە)!

## ٧-ئایا ڕاسته كەهەمیشه لادانی حوكمڕانی لارو ستەمكار حەڕامه چونكه هەرچۆن بێ زیانی لادانی لەهی مانەوەی زیاتره؟!

ئەم قسانەی ناوبراو ئەوەیان لێوەردەگیرێ كەبەهیچ جۆرێـك نابێ دەستكاری حوكمڕانی لارو ستەمكار بكرێو لابدرێ، سەرنج بده چی دەڵێ: (.. فأنـها تـزالُ بِمُواظبـة النصـح.. ولَيـس بخطـأ أو مُنكـر اكـبر كأحْداثِ الأنقسمات والفِرَقِ.. فالمنكر يُزالُ ولكن لَيْسَ بمنكر اكبر منه..).

وەك گوتمـان لـەم قسـانەیدا وا دەردەكـەوێ و وا هـەڵدەهێنجرێ كـه هەرچۆنێك دەست لەوەزعی حوكمڕانی مسوڵمانان بدەی هەر هەڵەیه، وه هەرچۆنێك دەستی لێبدەی مونكەرێكی گەورەترو زەرەرو زیانی زیاتره!

بەڵام كاك (ابو بصیر) بۆ خۆی لەپەراوێزی (شَرحُ العقيدة الطحاوية)دا پێچەوانەی ئەو ڕاوبۆچوونه بەپەسەند لەقەڵەم دەدات، بۆیه ئەگەر بڵێین (الشيخُ ابوبصير يَرُدُّ بِنَفْسِهِ على نَفْسِهِ)شتێكی زۆر ڕاسته، لەكتێبی ناوبراودا دەڵێ: (قُلْتُ قَولهُ: (لَمْ يَجِزُ الخرُوجُ عَلَيهِ وإنْ بَلَغَ في الظُلْمِ أيَّ مَبْلَغٍ) فيهِ نَظَرٌ وجُنوحٌ الى التَّفْريطِ بِما يَجِبُ على الأُمَّةِ نَحْوَ حاكِمِها في المُراقَبةِ والتقْويم، وفيـهِ إلغـاءٌ لِقـاعِدَةِ: (وجُـوبِ جَلْـبِ المَصـالِحِ ودَفْـعِ المَفاسِدِ، وتَقْديْرِ المَفاسِدِ ودَفْعِ الضَّرَرِ الأكبَرِ بالضَّرَرِ الأصْغَرِ..)[٦]

دیاره (شارح)[٧]ی عەقیدەی طەحاوی قسەیەك دەكاتو دەڵێ: دروست نیه دژی خەلیفەو دەستەڵاتدار بەچـەك ڕووبـەڕوو ببیـەوەو بـەرەنگاریی بكـەی هەرچەنده هەر زوڵمێك بكاتو زوڵمەكەی بگاته هەر ئەندازەیەك.

---

[٦] (تهذیب شَرحِ العَقيدةِ العَقيدةِ الطحاوية) لاپەڕه -٣٢٥- نووسینی: الشيخ ابو بصير.

[٧] كه بریتیه له (ابن ابي العِزِّ الحنفي).

جا کاك (ابو بصیر) خۆی دەربارەی ئەم قسەیەی سەرەوە دەڵێ: (فيْهِ نَظَرٌ) ئەمە جێگەی تێبینیی و سەرنجەو بەم شێوەیە نیە، بەڵکو ئەوە کەمتەرخەمی تێدایە لە ئەرکێکدا کە لەسەر ئوممەت پێویستە بەرامبەر بەدەستەڵاتدارو حاکمەکانی کە دەبێ چاودێرییان بکات و ڕاستیان بکاتەوە، وە لەو قسەیەدا کە دەڵێ: دەستەڵاتدار هەر زوڵمێك و هەر شتێك بکات نابێ دژی بوەستی، ئەوە بێگومان هەڵوەشاندنەوەی ئەو قاعیدەو بنچینە شەرعیەشە کە دەڵێ: (وجوب جلب المصالح ودفع المفاسد) واتە: فەرزە بەرژەوەندییەکان بەدەست بهێنرێن و زیانەکان دووربخرێنەوە، (وتقدير المفاسد ودفع الضرر الاكبر بالضرر الأصغر) واتە: پێویستە ئەندازەی زیانەکان دیاری بکرێت و ئەو زەرەرەی گەورە بوو نەهێڵدرێ و ئەوەی بچووك بوو (تَحَمُّل) بکرێ، واتە: ئەگەر تەماشا بکەی ئەو حوکمڕانەی حوکم دەکات خەلیفە تا خوارەوە، ئەگەر بزانی زەرەری حوکم کردنەکەی ئەو زیاترە لەزەرەری لابردنی دەبێ لای بەری، بۆئەوەی زەرەرە گەورەکە لەکۆڵ خۆت بکەیتەوەو زەرەرە بچووکەکە (تَحَمُّلْ) بکەی کە بریتیە لەڕاپەڕین لەدژی، جا خوێن برژێ، یان هەر شتێکی‌تر ڕوودەدات باڕووبدات، مادام زەرەرەکەی بچووکتر بێ لەزەرەری مانەوەی، دەبێ زەرەری بچووك (تحمل) بکرێ، وە هی گەورە پاڵ پێوەبنرێ و دووربخرێتەوە، بەکورتی: لەپێناوی لەخۆدوورخستنەوەی زیان و زەرەری گەورەدا پێویستە – نەك هەر دروست – کە زیانی گچکە تەحەممول بکرێ، دیارە ئەم مەسەلەیەش قاعیدەیەکی شەرعییەو ئەگەر (ابو بصیر)یش نەیڵێ هەروایە بەڵام من بۆیە لەزاری خۆیەوە نەقڵم کرد چونکە (المَرْءُ مُؤاخَذٌ بإقْرارِهِ) وە وەك عارەب گوتوویانە: (أُدينكَ مِنْ فِمِك).

هەروەها (ابو بصیر) لە (تعلیق) ی لەسەر رستەی: (وأما لُزُومُ طاعتهم وإنْ جارُوا فَلأنَّهُ يَتَرَتَّبُ على الخُروج مِنْ طاعتِهِمْ مِنَ المَفاسِدِ أضعافَ مايَحصُلُ مِنْ جَوْرِهِمْ..) کە (شارح)ی عەقیدەی طەحاوی دەڵێ: بۆیە

پێویسته فەرمانبەریی دەستەڵاتداران و حوکمڕانانەکان بکرێ هەرچەندە زوڵمیش بکەن، چونکە ئەو زەرەرو زیانەی کە لەسۆنگەی بەرەنگاربوونەوەو جەنگ لەگەڵ کردنیانەوە پەیدا دەبێ چەند قات زیاترە لەوەی کە بەهۆی ستەمو خراپەیانەوە پەیدا دەبێت.

ئەوە قسەی (مَتْن) و ئەسڵی کتێبەکەیە، جا (ابو بصیر) لەسەر ئەم رستەیە وەك (تَعْليق) دەڵێ: (قدْ تَقَدَّمَ انَّ هذا لَيْسَ على إطْلاقِه وانَّه لابُدَّ مِنْ تَقْديرْ المَفاسِدِ والمَصالِحِ المُتَرتِبةِ على الصَّبْرِ او الخُروجِ، وهذا يَعُود الى دَرَجةِ آنْحِرافِ الحاكم عَنِ الحقِ ومَدى سُهولَةِ خَلَعِه إنْ وَقَعَ الخيارُ على الخُروجِ، وضابِطُ المَسْألةِ: إعْمالُ القاعِدةِ بِتَجَّرِدِ عَنِ الهَوى التي تَأمُرُ: بِتَقْديمْ أقل الخيارَيْنِ ضَرَراً لِدَفع اشَدهِما ضرراً وفساداً..)[8]

پێشتر (شارح) وای باس کرد کە بەموتڵەقی ڕاپەڕین لەدژی ستەمکار هەرچۆن بێ زیانی زیاترە، بۆیە نابێ پەنا بەرینە بەر جەنگ و بەرەنگاربوونەوەو ڕاپەڕین، جا (ابو بصیر) دەڵێ:[9] نەخێر وا نیە، بەڵکو دەبێ هەم ئەو زیانانەو هەم ئەو قازانج و بەرژەوەندییانەش کە لەسۆنگەی بێدەنگ بوون و صەبرگرتن، یان ڕاپەڕین و دژایەتیکردنەوە سەرهەڵدەدەن هەردووکیان بەراورد بکرێن و بەتەرازووی شەرع و عەقڵ هەڵبسەنگێنرێن، جا ئەگەر ئەو بەرژەوەندییانەی کە بەهۆی لابردنییەوە پەیدا دەبن و دەستگیردەبن زیاتر بن لەو بەرژەوەندییانەی کەبەهۆی هێشتنەوەیەوە پەیدا دەبن ئەوە دەبێ لابرێت، هەروەها ئەگەر بزانرێ زەرەرو زیانەکانی هێشتنەوەی لەهی لادانی زیاترن، بەپێی

---

[8] (تهذيب شرح العقيدة الطحاوية) لاپەڕە: ٣٢٩.

[9] من خۆم قسەکانی (ابو بصیر)م زیاتر ڕوون کردوونەوەو شەرح و تەفسیری ترم خستوونە سەر.

بنچینەی شەرعیی (جَلْبُ أعظم المصلحتین ودفع أعظم المفسدتین) کە زانایان لەسەری ڕێك کەوتوون بەهەمان شێوە دەبێ لابرێت.

دیارە حوکمو بڕیاری ئەو لابردنەش تاڕاددەیەکی زۆر پەیوەستە بەئەندازەی لاڕێبوونی ئەو حاکمو دەستەلاتدارەوە، ئەگەر هەندێك وردە هەڵەی هەبن (تَحَمُّلْ) دەکرێن، بەلام ئەگەر زۆری لادابوو، ئەوە حسابێکی‌ترە، هەروەها تەماشای ئاسانی لابردنەکەی دەکەین ئەگەر زانیمان بەئاسانی لادەبردرێ، دەبێ لای بەرین، وە ئەگەر زانیمان زۆری تێ‌دەچێ، دەبێ تەماشای تێچوونەکەی بکەین‌و بزانین تێچوونەکەی زیاترە لەزۆر تێچوونی مانەوەی، ئەگەر زیاتر بوو نابێ دەستی لێ‌بدرێ، وە هەرکاتێك بڕیاری لابردنی درا دەبێ سەرنج بدەین داخوا ئیحتیمالی سەرگرتنی لاچوونەکەی چەندە، هەروەها ئەو زیانانەی بەو هۆیە پەیدا دەبن چەندن‌و چۆنن!

پاشان دەڵێ: ئەوەش کە ئەو مەسەلەیە (ضبط) دەکات ئەوەیە کە بەبێ کەوتنە ژێر کاریگەریی هەواو ئاوەزوو، ئەو قاعیدەیە (تطبیق) بکەین کە دەڵێ: کام لایەنی – واتە هێشتنەوەی حاکم یان لادانی – زەرەری کەمترە پێویستە ئەوەیان بکەین‌و کامیان زەرەری زیاترە دەبێ زیانە گەورەکە دووربخەینەوە جالێرەدا دەڵێم: شێخ (ابو بصیر) بۆچی بەڕەوای دەزانێ حاکم‌و پێشەوای مسوڵمانان کە لەسەر ئاستی ئۆممەت حوکم دەکات، لەحاڵەتێك دا خراپەکاریەکەی بێتە ئەندازەیەك کە (تحمل) نەکرێ، بۆ بەپێویست‌و دروستی دەزانێ کە لابردرێ مادام ئاسان بێ؟ بەلام بۆچی بۆ ئێمەی بەڕەوای نازانێ کەنەك خەلیفەیەك بەڵکو (مەلا)یەك دووربخەینەوە کەبەرپرسی کۆمەڵێك لەمسوڵمانانی کوردستانە؟! لەڕاستی‌دا ئەمەیە (بانێکەو دوو هەوا) یان وەکو گوتراوە (کیل بمکیالین)ە!.

# ٨-بەهەڵەداچوون لەدیاری کردنی هەڵوێستی زاناو پێشەوایانی (أهل السنة و الجماعة )دا دەربارەی بەشداریکردنی جەنگ لەکاتی کێشەو ئاژاوەو (فتنة ) ی نێوان مسوڵمانان دا

ئەگەر هەڵەبوونی فەتواکانی پێشتری کاک (ابو بصیر) زیاتر لەبەرئەوە بوو کە لەواقیعەکە شارەزایی نەبوو، وە هەندێك جاریش لەبەر تێنەگەیشتن و نەشارەزایی شەرعیی بوو، ئەمەیان ڕێك و ڕاست بەهۆی نەشارەزایی لەحوکمی شەرعی و بێ ئاگایی لەڕاوبۆچوون ئەهلی سوننەت و جەماعەتەوەیە.

بەڵێ کاک (ابو بصیر) لەم مەسەلەیەشیاندا دیسان بەهەڵەدا چووە کە گوتوویەتی: زانایانی (أهل السنة والجماعة) لەسەرئەوە ڕێککەوتوون کەپێویستە مسوڵمانان لەکاتی ڕوودانی ئاژاوەو کێشەی نێوان خۆیاندا لەماڵ دابنیشن و تێوەڕابمێنن!!

چەند فەرموودەیەك دێنێتەوە لەسەر ئەوە کە لەکاتی ئاژاوەو ناڕەحەتی مسوڵماناندا دەبێ پیاو لەماڵی خۆی دابنیشێ و هیچ هەڵوێستێك نەنوێنێ.

دوایی کاک (ابو بصیر) دەڵێ: (لِذا كانَ اتفاقُ اهْلِ العِلْمِ على أنَّ الذين اعْتَزَلُوا القِتالَ في الفِتْنةِ كابنِ عُمَرَ وغَيْرِهِ هُمَ اولى الناسِ بالحَق والصَّوابِ) واتە[١٠]: بۆیە زانایان لەسەر ئەوە ڕێك کەوتوون و یەك دەنگن کە ئەوە

---

[١٠] لێرەش دا خۆم ڕوونکردنەوەی زیاترم خستۆتە سەر قسەکانی (ابو بصیر).

هاوەڵ (صحابي)انەی کە لەکاتی ئاژاوەی عەلی کوڕی ئەبوو طالیب خوا لێیڕازی بێو نەیارەکانیدا کە لەجەنگەکانی (الجَمَل)و (الصفّين)و (نَهْرَوان) بەشداریيان کردو دژی سوپای خەلیفەی ڕاشیدی چوارەم جەنگیان کرد، لەماڵی خۆیان دانیشتنو کەنارگیر بوون، وەك (ابن عمر) خوالێیان ڕازیبێو غەیری ویش ئەوانە لەهەقو ڕاستییەوە نیزیکتر بوون.

جا جێی سەرسوڕمان ئەوەیە کە (ابو بصير) دەڵێ: ئەهلی عیلمو زانایان لەسەرئەوە ڕێك کەوتوون و یەك دەنگن، کە ئەو دانیشتوو و کەنارگرتووانە نیشانەیان پێکاوەو هەڵوێستی ڕاستیان هەڵبژاردوە!!

بەڵام لەڕاستیدا ئەوەی کە (ابو بصير) گوتوویەتی نەك هەر زانایان لەسەری یەك دەنگ نین، بەڵکو زانایان لەسەر پێچەوانەی ئەوە ئەگەر نەڵێین یەك دەنگن، دەڵێین زۆربەی زانایان ڕایان وایە با سەرنج بدەین چۆن؟

(الحافظ إبن حجر العسقلاني) لەشەرحی فەرموودەی (**إذا تواجَه المُسلِمانِ بَسَيْفَيْهِما فَكِلاهُما مِنْ أهْلِ النارِ، قيل: فهذا القاتِلُ فَما بالُ المَقْتولِ؟! قال: إنَّهُ ارادَ قَتْلَ صاحِبِهِ**)[11]

واتە: کاتێك دوو مسوڵمان بەچەکەکانیانەوە ڕووبەڕووی یەکتر بوونەوە هەردووکیان دەبن بە ئەهلی ئاگر، پێی گوترا: دیارە بکوژ حەقی خۆیەتی، بەڵام بۆچی کوژراوەکەش هەر ئەهلی ئاگرە؟ پێغەمبەر ﷺ فەرمووی چونکە ئەویش ویستوویەتی هاوەڵەکەی بکوژێ.

جا (ابن حجر العسقلانی) گوتوویەتی:[12] (وآحتَجَّ بِهِ مَنْ لَمْ يَرَ القِتالَ في الفِتْنةِ وَهُمْ كُلُّ مَنْ تَرَكَ القِتالَ مَعَ علي في حُروبِهِ كَسَعْدِ بنِ ابي وقاصٍ

---

(11) رواه البخاري.

وعَبْدالله بن عُمَرَ ومحمدِ بنِ مَسْلَمةَ وابي بَكْرَةَ وغَيْرِهِمْ وقالوا: يَجِبُ الكَفُّ حتى لَوْ أرادَ أحدٌ قَتْلَهُ لَمْ يدفَعْهُ عَنْ نَفْسِهِ، ومِنْهُمْ مَنْ قال: لايَدخُلُ في الفِتْنَةِ فأنْ أرادَ أحدٌ قَتْلَهُ دَفَعَ عَنْ نَفْسِهِ) دەڵێ: ئەم فەرموودەیە کەهێنامان، ئەوانەی کە ڕایان وایە نابێ لەکاتی ئاژاوەو کێشەی نێوان موسوڵمانان دا بەشداری جەنگ بکرێ، ئەو فەرموودەیەیان بەبەڵگە هێناوەتەوە، ئەوانیش هەموویان ئەو کەسانەن کە لە جەنگەکانی (ئیمام عەلی کوڕی ئەبووطالیب) دا خوای لێ ڕازی بێ بەشدارییان نەکرد دژی نەیارەکانی، کە ئەمانە بوون، سەعدی کوڕی ئەبی وەققاس، موحەممەدی کوڕی مەسلەمە، عەبدوڵلای کوڕی عومەر، ئەبی بەکرە، وە هەندێکیتریش، کە بەژمارەی پەنجەکانی دەست دەژمێردرێن، بەشداری جەنگەکانیان نەکردو لەماڵی خۆیان دانیشتن.

جا (ابن حجر) پاش ئەوەی هەم قسەی ئەوانەی ئەو فەرمایشتە بە بەڵگە دێننەوە کە گوتوویانە: پێویستە ئینسانی موسوڵمان بەشداری شەڕو ئاژاوەی نێوان موسوڵمانان نەکات، وە ئەگەر موسوڵمانێك ویستی بیکوژێ نابێ بەرگری لەخۆیشی بکات، بەڵکو دەبێ کراسەکەی بەپێش چاوی خۆیەوە بگرێ بۆئەوەی بریقەی شمشێر نەبینێت، وەهەم هی ئەوانەش کە گوتوویانە: نابێ بچێتە نێو جەنگەوە بەڵام ئەگەر یەکێك ویستی بیکوژێ دەبێ دیفاع لەخۆی بکاتو ڕێ نەداتو بیکوژێت. ئنجا (ابن حجر) ڕەحمەتی خوای لێبێ، دوای ئەوەی قسەی ئەوانە بەئەمانەتەوە نەقڵ دەکات، دەڵێ: (وذَهَبَ جمهورُ الصحابةِ والتابعين الى وُجوبِ نَصْرِ الحَقِ وقِتالِ الباغينَ، وحَمَلَ هؤلاءِ الأحاديثَ الوارِدَةَ في ذلك على مَنْ

(١٢) (فتح الباري) بەرگی -١٤- لاپەڕە -٥٣٠-.

ضَعُفَ عَنِ القِتالِ أَوْ قَصُرَ نَظَرُهُ عَنْ مَعْرِفَةِ صاحِبِ الحَق..) واته :[13] زۆربەی هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ و شوێنکەوتووانی هاوەڵان ڕایان وایە کە کێ لەسەر حەق بێ، پێویستە پشتی بگیرێ‌و ئەوانەی کەیاخی بوون جەنگیان لەگەڵدا بکرێت، وە ئەو فەرمایشتانەش کە لەو بارەوە هاتوون‌و فەرمان بەوە دەکەن کە دەبێ لەو کاتانەدا ئینسان لەماڵی خۆی دابنیشێ، دەربارەی کەسانێکە کەیان شەڕیان پێ‌ناکرێ، لەبەر لاوازیی، یان حەقیان بۆ دەرنەکەوتوە، دیارە جاری وایە کابرا بەتەبیعەت ترسی هەیە، یان لاوازو نەخۆشە، یان خاوەن حەقی بۆ دەرنەکەوتوە لەم حاڵانەدا لەماڵ دادەنیشێ تا بۆی دەردەکەوێ کێ لەسەر حەقە، ئەمەیان ڕێی تێ‌دەچێ‌و دەگونجێ.

دوا بەدوای ئەوە (ابن حجر) دەڵێ: (قال الطَّبَري: لَوْ كانَ الواجِبُ في كُلِ آختلافِ يَقَعُ بَيْنَ المسلمينَ الهَرَبُ مِنْهُ بِلُزومِ المَنازِلِ وكَسْرِ السُّيُوفِ لَما أُقيْمَ حَدٌ ولا أُبْطِلَ باطِلٌ، ولَوَجدَ أهْلُ الفُسوقِ سَبْيلاً الى آرتِكابِ المُحرَّماتِ مِنْ أخْذِ الأمْوالِ وسَفْكِ الدِماءِ وسَبي الحَريْم، بأنْ يُحارِبوهُمْ وَيكُفَّ المُسْلِمون أيْدِيَهُمْ عَنْهُم بِأَنْ يَقُولوا: هَذِهِ فِتْنَةٌ وقَدْ نُهينا عَنِ القِتالِ فيها، وهذا مُخالِفٌ للأمْرِ بالاخْذِ على أيْدي السَفَهاءِ) واته: (ئیمام طەبەری دەڵێ: هەر کێشەیەك کە دەکەوێتە نێوان مسوڵمانان‌و ناکۆکی‌یان لەنێواندا پەیدا دەبێ، ئەگەر (واجب) ئەوە بووایە کابرا ڕابکات بۆ ماڵی خۆی‌و شمشێرەکەی خۆی بشکێنێ، بێ‌گومان ئەوکات نەهیچ سزایەکی شەرعی دەچەسپێنراو نەهیچ ناحەق (باطل)ێکیش

---

[13] خۆم قسەکانی (إبن حجر)م زیاتر شەرح کردوون‌و ڕوونم کردونەوە بێ‌ئەوەی دەستکاری نێوەڕۆکی قسەکانی بکەم.

لەنێو دەبرا، وە ئەهلی گوناح و تاوان ڕێگایان بۆ تەخت دەبوو کە گوناح بکەن، وەك زەوت کردنی ماڵی خەڵك و خوێن ڕشتنی خەڵك بەناحەق و دەستدرێژیکردن بۆ ماڵ و نامووس و ئابڕووی خەڵك، چۆن ڕێگا تەخت دەبوو بۆ ئەهلی گوناح؟ بەوەی کە ئەوانە بەپارە بەکرێ دەگیرێن و تالآن و بڕۆ دەست پێدەکەن، چاویان لەتۆڵە (انتقام)یە، ئیدی دەست بەشەڕ بکەن و خۆیان بەهێزبکەن و خەڵکیان لێکۆببێتەوە، بەلآم مسوڵمانانی دیکەش دەستی خۆیان بگێڕنەوەو بڵێن: بەخوا ئەوە ئاژاوە (فتنة)یەو نەهی‌مان لێکراوە کە لە ئاژاوە (فتنه)دا بەشدار بین، بۆیە لەماڵی خۆمان دادەنیشین و هیچ هەڵوێستێك نانوێنین! بێگومان لەحاڵێکی ئاوادا ئەوانەی لەماڵەوەش دانیشتوون سەلامەت نابن، پاشان (طَبَري) دەڵێ: (وهذا مُخالِفُ للأمْرِ بالأخْذِ على أيدي السُّفَهاءِ) واتە: ئەوەش پێچەوانەی ئەو دەق (نص)ە شەرعی‌یانەیە کە فەرمان دەکەن دەستی زاڵم و ستەمکاران بگیرێ و نەهێڵرێ زاڵم و نەفام و گوناحباران بەئارەزووی خۆیان تەراتێن بکەن).

بێگومان هەر ئەمەش قسەی حەق و بەجێیەو بەس ئەمە قسەی (عالم)ە سەر ڕاست و ڕەسەنەکانی ئیسلامەو هەرئەوەش ڕای ئەهلی سوننەت و جەماعەتە، نەك ئەوەی کاك (ئەبو بصیر) دەڵێ و پێی‌وایە ئەوانە لەسەر حەق بوون کە لەماڵی خۆیان دانیشتوون و ژمارەیان پێنج شەش (صحابي)یە!! لەحاڵێك دا کە (جمهور)ی هاوەڵان (الأصحاب) لەخزمەتی ئیمام (علي کوڕی أبو طالب)دا بوون لەجەنگەکانی‌دا دژ بەیاخی بووەکان، و (جمهور)ی شوێنکەوتوانی هاوەڵان (تابعين) و زۆربەی زانایانیش هەر لەگەڵ ئەم ڕاوبۆچوونە دان!!

ئیدی کاك (ابو بصیر) ئەم ڕایەت لەکوێ هێنا؟ لەکام کتێبە شەرعی‌یەکاندا هەیە؟ نازانین وەڵامی چی‌یە، بەڵام دڵنیام کەوەڵامی ئیقناع کەری پێ نیە، چونکە نیە! هەروەها (ابن حجر العسقلاني) دوا بەدوای ئەم باسانە لەهەمان لاپەڕەدا گوتوویەتی: (وَقَدْ أَخرَجَ البَزارُ في حديث: (القاتِلُ والمَقْتولُ في النارِ)) زيادَةً تُبَينُ المُرادَ وهي: (إذا آقْتَتَلْتُمْ على الدُّنيا فالقاتِلُ والمَقْتول في النارِ) واتە: (البَزار) کە یەکێکە لەفەرمووودەناسان لەفەرموودەی (القاتل والمتقول فى النار) بکوژ و کوژراو لەنێو ئاگر دان، زیادەیەکی هێناوە، واتە: لە فەرموودەی پێغەمبەر ﷺ کە مەبەستەکە ڕوون دەکاتەوە، دەفەرموێ: (إذ آقْتَتَلْتُم على الدُّنيا فالقاتِلُ والمَقْتُولُ في النارِ) واتە: (هەرکات لەسەر دونیاو بەرژەوەندی‌یەکانی دونیا بەشەڕهاتن‌و بەڵگەو پاساوی شەرعی‌تان بەدەستەوە نەبوو ئەوکاتە کوژەرو کوژراو لەنێو ئاگردان).

بەڵام بێگومان ئەگەر هات‌و شەڕو کوشتارەکەی نێوان مسوڵمانان لەسەر دنیاو بەرژەوەندی‌یەکانی و شتی ناهەق نەبوو، ئەوە حوکمەکەی جیایەو دەستدرێژکار لەنێو ئاگرەو کەسێکیش کەبەرگریی لەهەقی شەرعیی‌و ڕەوای خۆی دەکات پاداشتی هەیە، وەك ئەم فەرموودانە دەیگەیەنن کە دەفەرموون: (مَنْ قُتِلَ دُونَ مالِهِ فَهُوَ شَهيدٌ)[14] (ومَنْ قُتِلَ دُونَ مَظلَمَتِهِ فَهُوَ شَهيدٌ)[15].

---

[14] رواه أحمد ومسلم والترمذي عن ابن عمر ورواه أبوداود والترمذي وحسنه والنسائي وابن ماجه عن سعيد بن زيد وزاد: (ومَنْ قُتل دون دمه فهو شهيد، ومَنْ قتلَ دون دينه فهو شهيد، ومَنْ قُتِلَ دون أهلِهِ فهو شهيد) بڕوانە: (كشف ومزيل الألباس..) ج٢ص ٣٥٣.

[15] رواه أبوداود.

کەواتە: هەرکات مسوڵمانان لەسەر بەرژەوەندییەکی دونیایی و لەسەر زەعامەت و کورسی و پلەو پایەو ماڵ و سامان پێکەوە بەشەڕ هاتن، ئەوە بکوژ و کوژراو لەنێو ئاگردان، ئنجا (إبن حجر) دەڵێ: (ويُؤَيدهُ ما اخْرَجُ مُسْلِمٌ بِلَفْظِ: (لاتَذْهَبُ الدُّنْيا حتَّى يَأتِيَ على الناسِ زَمانٌ لايَدْري القاتِلُ فيمَ قَتَلَ؟ ولا المَقتولُ فِيمَ قُتِلَ؟ فَقِيلَ: كَيْفَ يكونُ ذلكَ؟ قال الهَرَجُ، القاتِلُ والمَقْتولُ في النارِ) واتە: ئەو فەرموودەیەش کە (مسلم) گێڕاویەتەوە، پشتگیری ئەو ڕایە دەکات کە گوتمان، فەرمایشتەکە دەفەرموێ: (دونیا کۆتایی نایەت تاکو ڕۆژگارێك بەسەر خەڵکیدا نەیەت کە ئەو کەسەی خەڵکی کوشتوە نازانێ لەسەرچی کوشتوویەتی و ئەو کەسەش کەکوژراوە نازانێ لەسەرچی کوژراوە، گوتیان: چۆن شتی وا دێتە پێش ئەی پێغەمبەری خوا؟ فەرمووی: (الهَرَجُ) واتە: تێکەڵی و پێکەڵی یەك و ئاژاوەیەك دێتە پێش کەس نازانێ چۆنە! (القاتل والمقتول في النار) لەو حاڵەتەدا بکوژور کوژراو لەنێو ئاگردان).

بەڵام بێگومان ئێمە ناتوانین بڵێین: ئەو کەسەی دیفاعی لەخەلیفەی بەحەقی مسوڵمانان (علي کوڕی ابو طالب)کردوە لەنێو ئاگردایە، هەڵبەتە هاوەڵان و زۆرینەی زانایان پێیان وایە کەجەنگی نێوان هاوەڵان بە (تأويل)ەوە کراوە، لەبەرئەوە هەرچۆنێك بێ ئیمام (علي) و جەماعەتەکەی دوو پاداشتیان هەیە چونکە هەقیان پێکاوە، (معاوية) و ئەوانیتریش پاداشتێکیان هەیە چونکە (تأويل)یان کردوەو (إصابة)یان نەکردوە، جگە لە خەواریج، چونکە ئەوان فەرموودەیان زۆر لەسەرە کە گوناحبارن و ئەهلی دۆزەخن.

کەواتە لەکاتێکدا کەپشتگیری حەق دەکرێ‌و دیفاع لەحەق دەکرێ ئینسان پاداشتی هەیە نەك لەئاگردایە!

بەڵێ جا ئەوەیە هەڵوێستی ڕاست‌و دروست کەزۆربەی هەرەزۆری زاناو پێشەوایانی ئیسلام لەسەری ڕێك کەوتوون، وە هەر بۆیەش هاوەڵە بەڕێزو دڵسۆزەکانی پێغەمبەری خوا ﷺ زۆربەی موتڵەق‌و هەرەزۆریان لەجەنگەکانی نێوان خەلیفەی چوارەم (علي کوڕی ابوطالب) ڕەزای خوای لێ‌بێ‌و نەیارەکانی‌دا واتە: لەهەرسێك جەنگی (جَمَل) و (صفین)و (نَهروان)دا پشتگیری عەلی‌یان کردو بەشداری جەنگیان کرد، وەئەوانەی دانیشتن‌و گۆشەگیر بوون لەچاو بەشداربووان دا بەژمارەی پەنجەکان دەژمێردرێن‌و لەچەند ڕیوایەتێکیش دا هاتوە کە دوایی لەو هەڵوێستە (بێ‌لایەنە)ی‌یەی خۆیان پەشیمانیش بوونەتەوە، (سەعدی کوڕی ئەبی وەققاص) و (عەبدوڵڵای کوڕی عومەر) پەشیمان بوونەتەوە، دوای ئەوەی کە تەماشایان کرد حوکمەکە بوو بە حوکمی (یزید)و بەناو خەلیفە ستەمکارە ئەمەوی‌یەکانی‌تر، ئەو هاوەڵە بەڕێزانە لەهەڵوێست‌و ئیجتیهادی هەڵەی خۆیان پەشێمان بوونەوەو گوتیان کاتی خۆی ئەگەر ئێمە پشتگیری خەلیفە (علی) مان بکردایە وەزع بەئێستا نەدەگەیشت.

## ٩-ئایا ڕاستە ئێمە لەبەر ئیمان کزیی و دین کاڵیی ئەو گۆڕانکارییەمان کردوە؟!

ڕەخنەو تێبینی یەکی ترمان لەسەر فەتوانامەکەی کاک (ابو بصير) ئەوەیە کە دەڵێ: (مما ينبغي انْ يَعْلَمَهُ الجَميعُ انَّ هذا التَفرُّقَ والتَّنافُرَ والبَغْضاءَ الحاصِلَ بَيْنَ المُسْلمينَ في كوردستان وغَيْرِها ماكانَ لِيَكونَ إلا لِنسيانِ حَظٍ مِنَ الدينِ والتَّوْحيْدِ) واتە: (پێویستە هەموو لایەك بزانێ کە ئەو پەرتەوازەیی و ناکۆکیی و بوغزو غەرەزەی لەنێوان مسوڵمانانی کوردستان و غەیری ئەوانیش دا دورست بووە هەر بەهۆی لەبیرچوونەوەی بەشێك لەدینداریی و ئیمان و خوا بەیەکگرتن یانە).

لەوەڵامی ئەم قسانەی شێخ (ابو بصير) یش دا دەڵێم: لەڕاستی دا ئێمە پەرتەوازەییمان نەکردوە، پاشانیش کاك (ابو بصير) بەبێ ئەوەی ئاگای لەو خەڵکە بێ، وا دەزانێ لەبەر ئیمان لاوازیی و کەم دینی ئاوامان کردوە، ئاخر کاگەگیان چۆنت زانی و کێ دەڵێ لەبەر دینداریی و لەترسی خوا ئەو کارەمان نەکردوە؟! وە بۆئەوەی کە خوا لێمان ڕازی بێ و دووچاری سزاو جەزرەبەی نەبین؟! چۆن بۆت هەیە حوکم و بەسەر دڵ و دەروونی ئێمەدا بدەی؟! چۆن دەڵێی مەبەستیان پێ خوا نیە؟! خۆ هەر خوا (عليمٌ بِذاتِ الصُّدور)ە؟! بێگومان ئەوەش ناشەرعی یەکی دیکەیە کە من بڵێم فلان مسوڵمانی (جەزائیر) یان (ئەفغانستان) مەبەستی پێ خوا نیە، دەتوانم بڵێم بەگوێرەی ڕواڵەتی شەرع کارەکەی هەڵەیە، بەلام ئایا مەبەستی پێ خوایە یان نا؟ دەبێ هەر خوا حوکم بدات بەسەری دا (إنه عَليمُ بذاتِ الصُّدور).

# ١٠-تێڕوانینی ڕەش بینانەو بەدبینی‌یەکی خەستو خۆڵ

ڕەخنەو تێبینیی‌یەکی‌ترمان لەسەر قسەکانی ئەوەیە کە زۆر ڕەش بینانە تەماشای وەزعەکەمان دەکاتو دەڵێ: (وهذا الأنقسام الحاصلُ الذي آلمَنا جميعاً لَنْ يكونَ الأوَّلَ والأخيرَ بَلْ سَتَتْبَعُهُ إنقساماتٌ وإنْقِساماتٌ مادامت الأهْواءُ هي التي تَحكُمُ ومادامَتِ المطالِبُ الحزبيَّةُ الضَّيقةُ هي التي يُنَفَّذُ حُكْمُها ولَيْس حُكْمُ الله والضحية هُوَ الشَّعْبُ المُسْلِمُ الكُردي) واتە: (ئەم دابەش بوونەش کە هەموو لایەکمانی ئازار داوە، دابەش بوونو لەت لەت بوونی تریشی بەدوادا دێ مادام هەواو ئارەزووی خۆیان حوکم بکاتو مادام بەرژەوەندی‌یە تەسکە حیزبی‌یەکان حوکم بکەن نەك حوکمی خوا، وەباجەکەیشی هەر گەلی مسوڵمانی کورد دەیدات).

بێ‌گومان ئەم قسانەی (ابو بصير) ڕەشبینی‌یەکی تەواویان تێدا دەردەکەوێ، کە نەدەبوو وابێ، چونکە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: (إذا سمعتم الرجلَ يقولُ هلك الناسُ فَهُوَ أهْلَكُهُمْ)[١٦]

---

[١٦] رواه مسلم، دیارە هەم بە (اهْلَكَهُمْ) و هەم بە (اهلَكُهُمْ)یش هاتوە، یانی: فەوتاوترین یان بەڵێ ئینسان نابێ هەواڵی خراپ بەخەڵکی بداتو نابێ بێ‌ئومێدو ڕەشبین بێ بەشێوەیەك کە بڵێ: مسوڵمانان فەشەلیان هێناوەو لەکوێو کوێ شکستیان خواردوە، وە لەپشت پەردەی ڕەشەوە سەیرکردنی مسوڵمانانو کاری ئیسلامی خراپەو کاریگەریی خراپیشی لەسەر دەروون دەبێو ئەو فەرمایشتەی پێغەمبەریش چاکترین بەڵگەیە لەوبارەوە.

واتە: (هەر کاتێك لەکابرایەکتان بیست گوتی: خەڵك لەنێوچوون، دیارە خۆی لەنێوی بردوون)، ئنجا کەکاك (ابو بصیر) دەڵێ: (ئەو دابەش بوونەی هەموو لایەکمانی ئازار داوە) ڕەنگە هەر کاك (ابو بصیر)ی بێئاگا لەواقیعەکەو خەڵکێك کەبەرژەوەندی لیتێك چووە یان وەك وی بێئاگایە، ئەگەرنا مسوڵمانان لەدەرەوەو نێوەوەی کوردستان بەبیستنی هەواڵی ئیعلانکردنی (کۆمەڵی ئیسلامیی) ئەوپەڕی خۆشحاڵی خۆیان دەربڕیوە، وەپێم وایە کاك (أبو بصیر)یش ئەگەر هاتباو پێش نووسینی فەتوانامەکەی ئەو ڕاستییانەی بۆ ڕوون کرابایەوە، وەك دواتر برایانمان فاکس و تەلەفۆنیان بۆی کردوەو گلەیی زۆریان لێیکردوە، ئەوە بێگومان هەڵوێست و بیروڕای دەگۆڕاو هێندە ڕەش بینانە سەیری ئەو گۆڕانکاریەی نەدەکرد.

# ١١-ئایا ڕاسته بەرپرسێتی (المسؤلية) لەئیسلام دا بەموتڵەقی خراپ و شوومە؟!

ڕەخنەو تێبینییەکیترمان ئەوەیە که کاك (ابو بصير) دەڵێ: (كلمة اخيرة الى كل مسلم مسئولٍ في كردستان: (إعْلَموا أنَّ الأمارَةَ لَيْسَ مَغْنَماً وإنَّما هي مَغْرَمٌ وخِزيٌ وَندامةٌ..) واته: (وشەیەکی کۆتاییم هەیە بۆ هەر مسوڵمانێکی بەرپرس لەکوردستان دا ئەویش ئەوەیە کەبزانن بەرپرسێتی دەستکەوت نیە، بەڵکو قەرزداریی و سەرشۆڕیی و پەشیمانییە)!.

بەڕاستی زۆر جێگەی سەرسوڕمانە کەپیاوێك خۆی بە (عالم) بزانێ و قسەی ئاوا بڵێ!!، چونکە بەرپرسێتی لەئیسلام دا ئەگەر بەحەقی خۆی بکرێ گەورەترین عیبادەتە، بابزانین زانایان چ دەڵێن لەو بارەیەوە: ئیمامی (الجويني) دەڵێ: (ثُمَّ قُرُباتِ العالمين وتَطوُّعاتِ المُقَرَّبين لاتُوازِنُ وَقْفةً مِنْ وَقَفاتِ مَنْ تَعَيَّنَ عَلَيْهِ بَذْلُ المَجْهودِ في الذَّبِ عَنِ الدينِ)[١٤] واته: (چاکەو خواپەرستیی خەڵکی وەخۆ لەخوا نزیك خستنەوەی خۆ لەخوا نزیك خەرەوان، هەمووی بێگومان هاوتای هەڵوێستێك و بەشێکی کەم نیە لەعیبادەتی ئەو کەسانەی کە دەیانەوێ دیفاع لەدین بکەن و کاروباری مسوڵمانان هەڵبسووڕێنن).

ئیمام (ابن تيمية)ش دەفەرمووێ: (يَجِبُ أنْ يُعْرَفَ أنَّ ولايةَ أمْرِ النّاسِ أعْظَمُ واجبات الدينْ، بَلْ لاقيامَ لِلدينِ إلا بِها)[١٥] واته: (پێویستە بزانرێ

---

[١٤] (غياثُ الأُمَم) لاپەڕە -٢٦٤-.

[١٥] (مَجْموعُ الفتاوى) بەرگی -٢٨- لاپەڕە -٣٩٠-.

کەسەرپەرشتی کاروباری مسوڵمانان کە گەورەترینی واجبەکانی دینە، بەڵکو دین بەوە نەبێ بەڕێوە ناچێ).

کەواتە هەر لەخۆوە حوکم بدەی کەهەرکەسێك بەرپرسی چەند کەسێك بێ، لەئیسلام دا ئەوە سەرشۆڕیی بۆ دەمێنێتەوە، بێگومان هیچ کەس نایکات![17] ئنجا ئەوەش پێچەوانەی دەقی ئایەتی قورئانە کەخوای پەروەردگار لەکۆتایی سوورەتی (الفرقان) دا وەسفی عەبدە ڕاستەقینەکانی خۆی دەکات دەفەرموێ: (وعِباد الرَّحمنِ الذينَ يَمْشُون على الأرْضِ هَوْناً... والذينَ يَقُولونَ رَبَّنا هَبْ لَنا مِنْ أزْواجِنا وذُرياتِنا قُرَّةَ أعْيُنٍ وآجْعَلْنا لِلمتَّقينَ إماماً) واتە: (بەندە ڕاستەقینەکانی خوای بە بەزەیی ئەوانەن کە... (چەند سیفەتێکیان لێ باس دەکات) و ئەوانەن کە دەڵێن ئەی پەروەردگارمان لێت دەپاڕێینەوە کە لەخێزانەکانمانو نەوەکانمان مایەی چاوڕوونیمان پێببەخشە (و صاڵحیان بکە) و بمانکە بەپێشەوا و چاوساغ بۆ پارێزکاران).

کەواتە سەرپەرشتی کردنی کاروباری مسوڵمانان هیواو ئاواتی (عبادالرحمن) ە، بەڵام بەڕێگای تەقواو دینداریی‌دا و لەسەر ڕێبازی پێغەمبەر ﷺ بەپێی شەرعی خوا جل جلاله.

بەڵێ ئەگەر بەرپرسێتی بەناهەق وەربگیرێ، پەشیمانی لەدوایەو خاوەنەکەی دووچاری سەرشۆڕیی و ڕووزەردی دەبێتو پەنجەی پەشیمانی دەگەزێ ئەگەرنا ئەگەر ئەو قسەیە بەموتڵەقی بگوترێ ئەوە بێگومان پێچەوانەی قورئان و سوننەتو سیرەو ژیانی پێغەمبەران

---

[17] وە سەرەنجام ئەو گەورەترین ئەرك و فەرزی ئیسلامە پەکی دەکەوێو هیچ کەسی لەخواترس توخنی ناکەوێو مەیدان بۆ دەغەڵ و پۆخەڵ و گەندەڵان چۆڵ دەبێت!!

بەگشـــیتی علیـــهم الصـــلاة والســـلام و پێغەمبـــەری کۆتـــایی (محمـــد) ﷺ بەتایبەتی و خەلیفە ڕاشیدەکانی (خلفاء الراشدون)و پێشەواو سەرکردە صالح و چاکەکارەکانی ئۆممەتەکەشیەتی!

لـێرەش کۆتـایی بەڕەخنـەو تێبینی یـەکانمان لەسـەر فەتوانامەکـەی هەردووك برامان:

(الشیخ أبو بصیر)و (الشــیخ أبـو إیثـار) دێنـین و داوای لێبوردنیـش لــەخوای پــەروەردگارو لێبــوردە دەکـــەین بــۆ ئــەوانیش و بــۆ خۆیشمان و دەڵێم:

(ربَّنا اغفرلَنا ولأخواننا الذينَ سَبَقونا بالإيمان وَلاتَجعَلْ في قلوبِنا غِلاً للذينَ آمنوا ربَّنا إنكَ رؤوف رَّحيمٌ)

آمـــــــين.

# ناوەڕۆك

## بۆ زانیاریت

ئەم زنجیرەیە بریتی بوو لە چوار ئاڵقە کە لە سێ نامیلکەی قەبارە نیو (A4)دا چاپکراو بریتی بوون لە:

١- ئاڵقەی یەکەم: بەڵگە شەرعییەکانی بنیاتنانی کۆمەڵی ئیسلامیی.

٢- ئاڵقەی دووەم و سێیەم: حوکمی لادانی خەلیفەو کاربەدەستانی مسوڵمان لەکاتی لاریی و ستەمکارییدا.

٣- ئاڵقەی چوارەم: شێخ ئەبو بەصیرو هەڵسەنگاندنێکی شەرعییانەو ژیرانەی فەتوانامەکەی.

